حكومەتی هەرێمی كوردستان

وەزارەتی خوێندنی بالاو توێژینەوەی زانستی

كۆلێژی پەروەردەی بنەرەت-دهۆك

بەشی مـێـــژوو-خوێندنی بەیانیان

قۆناغی(١) گروب A

راپۆرتێك دەربارەی :

# ( زمـــانی جەستە )

ئامادەكردن :

جیهاد صابر عبدالرحمن

بەسەرپەرشتی

م. بێریـــڤان

1441 2720 2020

# پــــێــرســـت

## زمانی جەستە:

زمانی جەستە بریتیە لە زانستێکی نوێ و سەربەخۆ، کە لە پەیوەندی و کۆمیۆنیکەیشنە جەستەییەکان، واتە؛ نا دەنگیەکانی مرۆڤ بە گشتی، و ئاکتەری شانۆ و دراما بەتایبەتی، دەکۆلێتەوە. ئەم بوارە وەکو زانستێکی تەواو سەربەخۆ چاودێرێکی وردە، هەروەها خوێندنەوە بۆ ئەو بۆچون و هەست و گوزارشتانە دەکات کەلە ڕێگەی ئاکارە فیزیکییەکانەوە دەردەکەون لە هەر مرۆڤێکدا. بۆ نمونە لە جوڵە و ئاماژەکانی چاو، و هێڵەکانی دەم و چاو بەگشتی، و جوڵەی پەل و دەستەکان دەکۆڵێتەوە لە کاتی قسەکردن و گفتۆگۆ کردندا.

توێژینەوە زانستییەکان ئەوەیان دەرخستوە کە گوزارەشتەکانی زمانی جەستە و هێڵەکانی دەم و چاوی مرۆڤ لە کاتی قسەکردندا، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ناخ و لایەنی هەست و بیرکردنەوەی ئەو کەسە دەردەخات، هەروەها ئەوەشیان دەرخستووە کە هەمیشە ئەو مانا و گوزارشتانەی لە هێڵەکانی دەم و چاوی مرۆڤدا دەردەکەون، ڕاستەخۆ پەیوەندی و کاریگەرییان هەیە لە سەر شێوازی جوڵاندنی دەست و شانەکان و مل، بەجۆرێک هەر ئاماژە و جوڵەیەک یەکسان بێت بە هەمان ئەو ئاماژە و جوڵانەی کە لە دەم و چاودا دروست دەبن لە کاتی قسەکردن و دەربریندا. چونکە میکانزمی ئیشکردنی میشکی مرۆڤ بە شێوەیەک کاردەکات کە لە یەک کاتدا هەمان( سیگناڵ)، هەمان (ئیشارەت) دەنێرێت بۆ جوڵەکانی دەم و چاو، کە پێشتر ناردویەتی بۆ زمان و لایەنی گوتن. بۆ ئەوەی لە ڕێگەی زمان و جوڵەکانی دەم و چاو مرۆڤ بتوانێت گوزارشت لە بیر و بۆچونەکانی بکات و پەیوەندییەکی ڕوون و ڕاست دروست بکات لەگەڵ کەسانی دەوروبەری.

## حەوت زمانی جەستە لە چاوی بەرامبەرەوە سەرنج ڕادە کێشدەکات

ڕەنگە کەمێک گران بێت دیاریکردنی سیفاتەکانی کەسایەتیەکی سەرنجڕاکێش، چونکە بیروبۆچوونەکان جیاوازە.

بەگوێرەی هەواڵەکەی ماڵپەڕی yasmina ئاماژەکانی زمانی جەستە لە %٥٠-٩٠ی تێگەیشتنی بەرامبەر ئاسانتر دەکات، هەربۆیە زاناکان لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان دەربارەی زمانی جەستە ئەنجامداوە، گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی حەوت بنەما لە چاوی بەرامبەرەوە سەرنجڕاکێشە:

١-کردنەوەی چاوەکان و تێڕوانینی بۆ ناو چاوەکانی، لەکاتی گفتوگۆکردندا.

٢-جگە لە سەرنجدانی چاوی بەرامبەر، پێویستە لەکاتی گوێگرتن ئاگاداری چاوتروکاندن بیت.

٣-بۆنی خۆشی جەستە و دەم، بنەمای سەرەکیە بۆ راکێشانی سەرنجی بەرامبەر و زیاتر بایەخپێدانت.

٤-چۆنێتی جوڵاندنی دەست و شان و پەنجەکانت، ئەگەر بۆ خوارەوە بوو ئاسایی، مانای ئاسوودەیی و ئارامی دەگەیەنێت، متمانەت بەخۆت هەیە، هەربۆیە بەرامبەریش بەوە رەفتارە بەختەوەردەبێت و زیاتر سەرنجدەدات.

٥-ئاراستەی پێیەکانت و شانت بە رووی بەرامبەردا، دانیشتنت بە شێوەیەکی رێک، بەهەمانشێوە مانای نزیکی و بایەخدان بە کەسی بەرامبەر دەگەیەنێت، هەربۆیە زیاتر سەرنجدەدات.

٦-وەستان بەشێوەیەکی رێک و گونجاو، مانای متمانە بەخۆبوون دەگەیەنێت، بەرامبەر زیاتر رادەکێشێت.

٧-هەوڵدان بۆ گۆڕینی دەنگ، ئەمە خاڵێکی سلبیە و دەبێتەهۆی دوورکەوتنەوەی سەرنجی بەرامبەر، بەڵام بە پێچەوانەوە وادەکات زیاتر بایەخ پێبدات.

## زمانی جەستە کەسایەتی لەناودەبات.

توێژینەوە زانستیەکان کە لەلایەن شارەزایانی بواری زانستی دەروونیەوە ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە کە گفتوگۆکردن و قسەکردن لەگەڵ کەسێک و متمانە بەدەستهێنان بۆ بیروڕاکانت ٧% پەیوەندی بە وشەکانتەوە هەیە ٣٨% بەشێوازی دەنگەوە و چۆنێتی دەربڕینی، لە ٥٥% زمانی جەستەت ڕۆڵدەبینێت، هەر بەو هۆیەشەوە هەندێک ڕەفتار و کرداری جەستەیی زیانی سلبی هەیە و دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی متمانەی تۆ.

بۆ ئەوەی لەکاتی گفتوگۆکردندا متمانەت بەهێز بێت، دەبێت هەوڵبدەیت ئەم حەوت هەڵەیە ئەنجام نەدەیت لە کردارەکانتدا.

١-کاتێک بەرامبەر کەسێک دەدوێیت، ئاگاداری نیگای چاوەکانت بەو تەرکیز بخەرە سەر کەسی بەرامبەر، سەیرکردنی تۆ بۆ جێگایەکی تر دەچێتە باری بێ ڕێزیەوە و متمانەی تۆ دەدۆڕێت و بڕوا بە قسەکانت ناکرێت.

٢-شێوازی وەستان و جوڵەی لەشی تۆ، هۆکارێکە بۆ دەرخستنی کەسایەتی تۆ و متمانەکردن بە قسەکانت لەلایەن کەسی بەرامبەرەوە.

٣-بایەخنەدان بەشێواز و دەربڕینی ڕووخسارت لەکاتی گفتوگۆکردندا، هۆکارێکی سەرەکیە بۆ نەمانی متمانە، واتە چۆن پێدەکەنیت لە چ کاتێکدا چۆن وادەکەیت توڕەیی ناخت بەسەر دەموچاوتدا زاڵنەبێت، هەموو ئەمانە کاریگەری هەیە.

٤-شێوازی تەوقەکردن لەگەڵ کەسی بەرامبەر، کاریگەری لەسەر متمانەی تۆ هەیە لەلای کەسی دووەم، ڕەنگە بە هێزێکی زۆرەوە تەوقەکردن هێما بێت بۆ ڕق یان دوژمنایەتی و کەسی بەرامبەر بەو شێوەیە تێبگات.

٥-کردنەوە و داخستنی لەپی دەستەکانت زۆر کاریگەری لەسەر متمانەی تۆ هەیە، داخستن و توندکردنی هەردوو دەست و هێنانی بۆ پێشەوە، هێمای داخراوی و کۆتاییهێنان بە قسە یان گرنگی نەدان بە قسەکانی کەسی بەرامبەر دەبەخشێت، ڕەنگە مەبەستی تۆ وانەبێت، بەڵام هەستەکانی کەسی دووەم واتێدەگات.

٦-سەیرکردنی ئاسمان یان سەرەوە لەبەردەم کۆمەڵە کەسێکدا، هێمایە بۆ بێ هێزی و لاوازی کەسایەتی تۆ و نەبوونی متمانە بەخۆبوون.

٧-قەبارەی نێوانی خۆت و ئەو کەسەی گفتوگۆ دەکەن، چونکە ئەگەر ئەوە نێوەندە زۆر بێت نائاسوودەیی دروست دەبێت و متمانە لاواز دەبێت گرنگی ئەو بابەتە کەم دەبێتەوە کە گفتوگۆی لەسەر دەکەن.

## شەش ڕێنمایی زمانی جەستە بۆ دروستکردنی متمانە لای کەسی بەرامبەر لە کاتی گفتوگۆ دا.

شێوازی دەرکەوتنی مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگەدا یەکیکە لەو لایەنە گرنگانەی کە هەریەکێک لە ئێمە بە بایەخەوە لێیدەڕوانێت. هەموو کەسێک ئارەزووی ئەوە دەکات کە خەڵکی زیاتر متمانەی پێبکەن.

زانستی زمانی جەستە یەکێکە لەو تەنکینکە گرنگانەی کە دەتوانین بەکاریان بهێنین بۆ دروستکردنی متمانە لە ناو خەڵکیدا.

بە پێی هەواڵێکی پیگەی (بیزنس ئینسایدەر)، شارەزایانی بواری دەروناسی مرۆڤ ئاماژە بەوە دەکەن کە هەندێک جار زمانی جەستە زیاتر لە قسەکانمان کاریگەری هەیە لەسەر لایەنی بەرامبەر و زیاتر لە قسەکانمان پەیامی لە خۆ گرتووە.

ئەمانەی خوارەوە چەند تەکنیکێکی زمانی جەستەن کە دەتوانی بەکاریان بهێنیت تا لەڕێگەیانەوە لایەنی بەرامبەر زیاتر متمانەت پێبکات:

١- پێکەنینی ڕاستەقینە

پێکەنینی درۆ کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ئاستی متمانە پێکردنت لە لایەن کەسی بەرامبەرەوە. بۆیە پێویستە تەنها ئەو کاتانە پێبکەنیت کە بەراستی لە ناخی دڵتەوە پێکەنینت دێت، ئەمە وات لێدەکات کە کەسی بەرامبەر وەک مرۆڤێکی ڕاستگۆ لێت بڕوانێت بکات. پێکەنینی ڕاستەقینە بە ئاسانی جیادەکرێتەوە لە پێکەنینی درۆ لە شێوازی کرانەوەی دەم، و شێوازی جوڵەی چاو و برۆ و ڕوومەت.

٢- کەمێک بۆ پێشەوە بنوشتێرەوە

گەر لەگەڵ کەسێکدا دانیشتیت، لەسەر کورسیەکەت کەمێک خۆت بۆ پێشەوە بنوشتێنەرەوە بەرەو کەسی بەرامبەر، یاخود لەسەر بەشی پێشەوەی کورسییەکە دابنیشە نەک هەمووی.

شارەزایانی بواری زمانی جەستە ئاماژە بەوە دەکەن کە هەتا لە ڕووی جەستەییەوە لە کەسی بەرامبەر نزیک ببیتەوە، ئاستی متمانە پێکردنت لەلای ئەو کەسە زیاتر دەبێت.

٣- سەیری ناوچاویان بکە

بۆ بەهێزکردنی ئاستی متمانە پێکردنت، لە کاتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ کەسێکدا ڕاستەوخۆ سەیری ناوچاویان بکە بەبێ چاو لادان. گەر وانەکەیت، ڕەنگە ئەو کەسە وای لێکبداتەوە کە تۆ ڕاستییەکان ناڵێیت یان خۆت متمانەت بە قسەکانی خۆت نییە کە دەیانڵێیت.

٤- سەرلەقاندن

پێویستە وا لە کەسی بەرامبەر بکەیت کە تۆ متمانەت پێی هەیە و گوێ لە قسەکانی دەگریت و لەگەڵیدا هاوڕایت. بۆیە گرنگە کە زوو زوو سەرت بلەقێنی بۆ کەسی بەرامبەر، ئەمە دەیسەلمێنێت کە تۆ بیروهۆشت لەلای ئەوانە، بۆیە وایان لێدێت کە هەست بە ئارامی بکەن لەگەڵ تۆدا.

٥- رووی پەنجەکانت بخەرە ئەو کەسە

لە کاتی گفتوگۆ کردندا هەوڵبدە ئاراستەی پەنجەکانی قاچت لەسەر زەوی بەرەو ئەو کەسە بێت کە قسەی لەگەڵدا دەکەیت. بەم شێوەیە تۆ دەیسەلمێنیت کە رووت لەو کەسەیە و بەتەواوی گوێت لێگرتووە و دەتەوێت زیاتر لەگەڵیدا بمێنیتەوە. بەڵام گەر ئاراستەی قاچت رووی لە شوێنێکی تر بێت، ئەوا رەنگە پەیامی ئەوە بە کەسەی بەرامبەر بگەیەنێت کە تۆ نیازی بەجێهێشتنی ئەو شوێنەت هەیە و دەتەوێت زوو گفتوگۆکە کۆتایی پێبێت.

٦- دەستت لە گیرفانت دەربهێنە

دەستخستنە گیرفان دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی بەرامبەر هەست بکات تۆ شتێکی لە دەشاریتەوە و هەست بە ئارامی ناکەیت لەگەڵیدا. بۆیە پێویستە دەستەکانت لەدەرەوە بن و کراوە بن بەرووی ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکەیت.

## زمانی جەستە (درۆزنەکان سەرلووتیان دەخورێنن )

زمانی جەستە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەبواری پەیوەندی کردن لەگەڵ بەرامبەر و هیچ کاتێک لە زمانی دەنگی کەمتر نەبوە و نابێت، چونکە زمانی جەستە لە ٥٥% و شێوازی دەربڕینی دەنگی لە ٣٨% و ٧% دەربڕینەکانە بە وشە و قسەکردن .

بونی زمانی جەستە لەلای هەموو تاکێک بەگشتی و لای سیاسیەکان بەتایبەتی گرنگی خۆی هەیە، ئەگەر لە ڕوانگەی سیاسیەوە سەیری زمانی جەستە بکەین، لە ڕووی جوڵەی دەست و سەر و دەموچاو دەبینین هەریەکێکیان ئاماژەیەکە، ئەم جۆرە لە ئاماژانە بەردەوام بونەتە جێگەی سەرنجی میدیاکاران بەتایبەت لەکاتی دیدار و چاوپێکەوتنە میدیاییەکانەوە لەگەڵ بەرپرسان و دەستەڵات داران، چونکە لەڕێگەی شێوازی دەرکەوتنیان و بەکارهێنانی هەندێک لە ئاماژەکان دەیانەوێت بێتاقەتی و ناڕازی بون و دڵەڕاوکێکانیان بشارنەوە، ئەمەش لەخۆیدا دەرنەخستنی ڕاستیەکانە.

لە زمانی جەستەدا دەتوانین پەیوەندیکردنی نا زارەکی بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش دەبێت ئەوانیش:

یەکەم: دەربڕینەکانی دەموچاو، ئەم جۆرە لە پەیوەندیکردن لەگەڵ بەرامبەر زۆر گرنگە، چونکە دەربڕینەکانی دەموچاو دەتوانێت هەستەکانی تاک دەربخات لەبەرامبەر هەر کار و کاردانەوەیەک بەبێ ئەوەی پەنا بۆ دەربڕینە وشەییەکان ببات و ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم جۆرە دەربڕینانەی دەموچاو لە جیهاندا یەک شێوازە.

دووەم: جوڵەی جەستە، ئەم جۆرەیان بەهەمان شێوە لە جیهاندا یەک شێوەیە و دەتوانرێت لەسەر شێوازەکانی ڕۆشتن و دانیشتن و جوڵەکان لێکدانەوە بکرێت،چونکە جوڵەی جەستە سەروەتێکی زانیاریە کە کاتێک لەگەڵ بەرامبەرەکەماندا مامەڵە دەکەین.

سێیەم: ئاماژەکان، ئەمەش شێوازی جوڵەی بەکارهێنانی دەستەکان دەگرێتەوە لەکاتی گفتوگۆ یاخود وتار خوێندنەوەکان بە تایبەت کاتێک قسەکەر دەیەوێت تەبریرێک بۆ قسەکانی بهێنێتەوە.

چوارەم: پەیوەندیکردنی چاوەکان: هەستی چاو زۆر گرنگە چونکە وەک دەوترێت چاوەکان ناتوانن درۆبکەن، هەربۆیە بەگرنگترین پەیوەندیکردنی نازارەکی ئەژمار دەکرێت،چونکە دەتوانێت ئاڕاستەی گفتوگۆکان بگۆڕێت.

## بەکارهێنەرانی زمانی جە ستە

هەموو مرۆڤێک ڕۆژانە بە ویستی خۆی یان بێویستی خۆی زمانی جەستە بەکاردەهێنێت. وەکو ئەوەی مامۆستا بۆ گەیاندن و فێرکردنی خوێندکارەکانی زمانی جەستە بەکاردەهێنێت، پزیشکەکانیش بۆ نەخۆشەکانی، ئەندازیارێکیش بێ بەری نییە لەم زمانی جەستەیە کاتێک ڕێنمایی دەداتە کرێکارەکانی بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان.

بە شێوەیەکی گشتی ژنان زیاتر دەتوانن زمانی جەستەی بەرامبەرەکانیان بخوێننەوە، چونکە ئەوان بە شێوەی زگماک ئەو هەستەیان هەیە کە دەتوانن بی بەکارهێنانی زمانی قسەکردن، ڕاز و ڕەمزەکان شی و شیتاڵ بکاتەوە.هەربۆیە زۆرێک لە پیاوان ناتوانن درۆ لەگەڵ ژنەکانیان بکەن. لە هەمان کاتدا ژنەکانیش زۆر بە ئاسانی دەتوانن خۆ ڕاگرین و قسە لە پیاوەکان بشارنەوە.زانیان باوەڕیان وایە ئەو هەستەی ژنان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوان دایکن، دایکان زۆرجار بە بێ ئەوەی کۆرپەکانیان زمانی قسەکردن بزانن، هەر بە زمانی جەستە لە کۆرپەلەکانیان تێدەگەن.باوەڕیش وایە زۆربەی ژنان لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەو خەسڵەتەن لە پیاو باشتر دەتوانن ڕێکەوتنەکان ئەنجام بدەن






## چارلی چاپلین و زمانی جەستە

کێ چارلی چاپلین ناناسێت؟ ئەو ئەکتەرە بەریتانییەی کە لەسەدەی بیست یەکێک بوو لە ئەستێرە بەناوبانگەکانی فیلمە بێدەنگەکان؟ بۆیە چارلی بەناوبانگ بوو بێ ئەوەی هیچ وشەیەک بڵێت بە گۆچانێک و شەپەقیەکەوە دونیای سەرسام کردبوو.ئەوکاتەی چاپلین ڕۆڵی ئادۆڵف هیتلەری دەگێڕا، ویستی بە جیهان بڵێت بەتەنیا وشە دەربڕین گوزارشت لە ڕەخنە و ئازاری مرۆڤ ناکات، بۆیە جوڵانەوەی دەست و قاچ، ئاماژەکانی دەموچاو، جلوبەرگی جیاوازیش خۆی لە خۆیدا زمانێکە بۆ گەیاندنی پەیامەکان.

## ترەمپ و زمانی جەستە:

دوور لە هەڵوێستە سیاسیەکانی سەرۆکی ئەمریکا دۆناڵد ترەمپ زۆرێک لە گوزارشتەکانی جیاواز و کاریگەرە.هەرچەندە بەلایەنی هەندێکی دیکەشەوە ئاکارەکانی زیادڕەوی تێدایە و هەڵسوکەوتەکانی دیکتاتۆریانەیە.

پرۆفیسۆر جێف بیتی کە پسپۆری زمانی جەستەیە دەڵێت" ترەمپ پەرتووکێکی کراوەیە، چونکە گوزارشتەکانی ڕوون و ڕاشکاوانەیە  هەرچەند زۆرێک لە سیاسیەکانی دیکە زۆربەی کاتەکانی خۆیان بە چاوپێکەوتن و دیبەیت بەسەردەبن، لەوێشەوە دەیانەوێت گوزارشتەکانی دەموچاویان بە بزە بشارنەوە.ئەم کارە وادەکات ئێمە نا ئاسوودە بین.لەبەر ئەوەی شتێک دەشارنەوە، بۆیە هەندێک جار زمانی جەستە ئابڕوویان دەبات بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن."

بیتی ئاماژەی بەوەشکردووە کە زۆرجار دەیانەوێت شیکار بۆ گوزارشتەکانی ترەمپ بکەن بۆ ئەوەی گوتەکانی و زمانی جەستە لێکبدەنەوە و بزانن ڕاستدەکات یان نە؟ هەمیشە شکست دەهێنن.ترەمپ چی دەڵێت و زمانی جەستەیشی هەمان شت دەڵێتەوە.لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو هەرگیز ڕاهێنانی بۆ شاردنەوەی زمانی جەستە نەکردووە.

ترەمپ بەوە ناسراوە کە چاو و نێوچاوانی دەهێنێتەوەیەک و دەمی دەکاتەوە.بەتایبەتی ئەو کاتەی کە تووڕە دەبێت.ئەمەش جیاوازە لەو سیاسیانەی کە ڕێگە بە خۆیان نادەن تووڕەکردنەکانیان بە ئاشکرا دەرببڕن. ترەمپ ئەوها دەبینرێت ناتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵ بێت، بە پێچەوانەوە ئەمە ئەوپەری زاڵ بوونە.



## گرنگی زمانی جەستە، بۆ پێشکەشکار و پەیامنێران

هەمیشە ئەوانەی لە سەر شاشەی تیڤییەکانەوە زۆرترین کات دەردەکەون و شیکاری و هەواڵ و بەرنامە پێشکەش دەکەن، پێویستە گرنگیی تەواو بدەن بە زمانی جەستەیان، تابتوانن بە وریایی و ئاگاییەوە جوڵە بکەن. پێویستە بە دەرکەوتنی ئەندامەکانی جەستەیان و چۆنیەتی جوڵە پێکردن و نواندنیان، ڕێز و خۆشەویستی و متمانە بۆ ئەو کەسانە دەربڕن کە لێیان دەڕوانن. بۆیە زۆر گرنگە ڕاگەیاندنکاران، گرنگی زۆر بدەن بەشێوازی دەرکەوتن و دانیشتن و بە پێوە وەستان و سەرجەم جوڵەکانی تری جەستە. زۆرکات بێژەر و پێشکەشکاران بە حوکمی تایبەتمەندی بەرنامەکانیان و شێوازی ڕێخکستنی مێز و کورسییەکانیان، نیوەی جەستەیان (لە کەمەر بۆ سەرەوە) دەردەکەوێت. بۆیە پێویستە بە وریاییەوە ئاماژەکانی دەست و ڕوخساریان بەکاربهێنن، چونکە لەم دۆخەدا دەست و ڕوخسار ئەندامی هەرە سەرەکین لە کۆپیکردنی ناخی کەسی قسەکەر، بۆیە بەو بەشە کەمەی جەستەیان پێویستە زۆرترین پەیامی ئەرێنی و ڕێز و هاوسەنگی، بۆ میوانی بەرامبەر و بینەرانی بەرنامەکە پیشانبدەن. بەڵام بە داخەوە هەتا ئیستا ئەم تایبەتمەندییە، نەبۆتە بەشێک لە جەستەی زۆرینەی پێشکەشکاران، زۆرێکیان ئاماژەی نەرێنی و نەگونجاو بەرامبەر بە میوان و بینەران بەکار دەهێنن. زۆر کات دەگاتە دۆخی توڕەیی و لەدەستدانی کۆنترۆڵ، یان جۆرێک لە ساردی و ناڕێکخراوەیی دەبەخشێت بە بەرنامەکە، یان بە ئاماژەکانی جەستەی میوان و بینەران بێزار دەکات.

## ڕۆڵ و گرنگی تەوقەکردن لە زمانی جەستەی سیاسیەکاندا

بە پێی زۆرێک لە سەرچاوەکان تەوقەکردن وەک نەریتێک لە سەردەمە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیەوە بەردەوامی هەیە، لەو کاتەوە تا ئێستاش هۆکارێکی گرنگە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکاندا ، کلتور و چۆنیەتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و جیاوازی لێکتێگەیشتنی کۆمەڵگاکانیش فۆڕم و لێکدانەوە و بەکارهێنانی جیاواز دەبەخشێت بەم جۆرە نەریتە، کەواتە تەوقەکردنیش بە پێی تێپەڕبوونی سەردەم و چەرخە جیاوازەکان گەشەی کردووە و لەگۆڕاندا بووە و هەر لەبەر ئەمەش لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە و لە کلتورێەوە بۆ کلتورێکی دیکە و لە تێگەیشتنی کەسێتیەکی سیاسی بۆ دانەیەکی دیکە جیاوازی هەیە و بە پێی بارودۆخ و تەمەن و ڕەگەز و ئاین و جۆری پەیوەندی کەسێتی ... هتد فۆڕمی جۆرێتی و کاریگەرێتی و چۆنیەتیەکەی دەگۆڕێ.

## پەیوەندی نێوان تەوقەکردن و سیاسەتکردن :

هەروەک لەبەشەکانی پێشووتردا باسم کرد ، ڕەفتار و جوڵەی سیاسیەکان زۆر جار لەگەڵ هەست و نەست و ناخیان یەکانگیر نابێتەوە، دەگونجێت لە ناخەوە هەستێکی شاراوە هەبێت و بە ڕق و توڕەیی و خۆپەرستی و هەستی دوژمنکاری نەخشەسازی بۆکرابێت، بەڵام بە پێچەوانەوە لە ڕەفتار و ئاماژەکانی جەستەیدا نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی هەستەکانی ناوەوەی ناکان، هەر لەبەر ئەمە کەسی سیاسی دەرکەوتە چەندەها شێواز دەگرێتەر بەر گەر بە شێوەیەکی ساختەش بێت تەنها بۆ ئەوەی وەک کەسێکی نیان و دڵسۆز و خودان متمانە دەربکەوێت، هەر بۆیە تەوقەکردن و دەست ئالاندن لە دەستی بەرامبەردا لەیەکەم ساتی بەیەکگەیشتدا یان لەبەر دەم فۆکسی کامێراکاندا یان لەسەرەتا و کۆتایی کۆنگرە و کۆبوونەوە و دانوستانەکاندا یان لە ساتی ماڵئاوایی خوداحافیزیدا وەک نیشاندانی ڕێز و شکۆ بۆبەرامبەر پیشانبدات.

## زمانی جەستەی سیاسییەکان، بەرهەم سالّح و ماکگۆرگ :

**بەرهەم سالّح بە زمانی جەستەچی بە مەکگۆرگ وت ؟**

ئەگەر بڕوانین لەو وێنەیی، کە وەک یەکەم وێنەی سەرەکی بابەتەکە لە سەرەتاوە دانراوە، دەبینن دکتۆر بەرهەم کەیفی بە مەکگۆرک نایەت، ڕوخساری ماتی، شێوازی دانانی دەست و قاچی، پڕە لە بێزاری، گلەیی، سەرزەنشت و گرنگیپێنەدان. جەستەی ڕووی لە مەکگۆرگ نیە سەریشی بە ئاراستەی پیچەوانەی ئەو سوڕاندووە و ئاراستەی پیکانیشی بەرەو لای ئەو نەسوڕاوە، ئەمە بێجگەلەوەی زیاتر لەوە دەچێت لە دۆخی بیرکردنەوە دابێت، ئامادەگی مەکگۆرک زۆر دڵی خۆش نەکردووە (ئەمە لەسەرجەم وێنەکانی تریدا هەستی پێدەکرێت). وەک وتمان پێدەچێت د.بەرهەم لە دۆخی بیرکردنەوە دابێت، وەک دەبینین دەستی ڕاستی لە ناو دەستی چەپیدایە،(د.محمد الصیرفی)، لە پەرتووکەکەیدا بە باونیشانی (التواصل الإداری)، باسی لەم شێوازە دەستگرتنە کردووە و پێی وایە، نایەوێت ئەو بابەتەی بیری لێدەکاتەوە و بیخاتەڕوو یان ئاشکرای بکات، هەروەک ئەوەی بەلاشعوری دەیەوێت ڕێگری لیبکات، ئەم دەستلێدانە یان ئەم پەیوەندی خودییە، ئەمەش ئامرازێکە بۆ دڵنیابوونەوە. لە خوارەوە دەقی نوسراوەکەم داناوە، کە هاوشێوەی دەستگرتنەکەی د.بەرهەمی ڕوونکردۆتەوە. (١٣)

لەبەرامبەردا مەکگۆرک بەشێوەیەکی ئاسایی و (تاڕادەیەیش مسەیتەر) دانیشتوە بەڵام بەرەو لای دکتۆر وەرسوڕاوە، وا خۆیی پیشاندەدات کە هاوڕایە لەگەڵیدا، بەڵام ماغزای وێنەکە شتێکی دیکە دەڵێت، هەرچیبێت مەکگۆرک بەپەلەوە ئامادەیی قسەکردن و گفتوگۆیی تێدایە.



**لیستی سەرچاوە:**


١- وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە: گۆران محمد فەقێ، کتێبی زمانی جەستە، نەورۆزی ٢٠١٦

٢- https://www.xendan.org/life/detailnews.aspx?jimare=10493&babet=35&relat= 7038&__cf_chl_jschl_tk__= http://ashte.org/index/?p=4272

٣- کۆمەلیک پسپۆر، سالی ٢٠٠٩، چاپی نوێ، ناوەندنی بلاوکردنەوە ئارام-سلێمانی ،ناوی کتێب زمانی جەستە

٤- فەقێ ابراهیم ،سالی ٢٠١٣، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا ، ناوی کتێب رینمایی شیوازەکانی جەستە

٥- سیوەیلی سامان، سالی ٢٠١٨، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، ناوی کتێب زمانی جەستی کەسییەتی.

٦- . پ.ی. د.دانا علی سالح، کاریگەری زمانی جەستە لە دانوستانە سیاسیەکاندا، وەرگێران و زیادکردن؛ هاوکار رەفیق، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٧.

٧- هاوکار رەفیق، یانزە بەش دەربارەی زمانی جەستە لە بوارە جیاوازەکاندا، ماڵپەڕی پیوکەی میدیا، بەشی ڕیپۆرتاژ. یان ١٤ بەش لەم ماڵپەڕە(سنور میدیا) لە بواری سیاسیدا، لە بەشی ڕاپۆرتدا.

٨- چرۆ شەهاب ، زمانی جەستە (درۆزنەکان سەرلووتیان دەخورێنن)، Knwe.org کوردستانی نوێ

٩- تونیا ریمان، قوة لغة الجسد،ترجمة : رفیف غدار، الدار العربیة للعلوم ناشرون، بیروت، ٢٠٠٩